# دیاریا سەرێ سالێ







حکومەتا هەرێما کوردستانێ
وەزارەتا رەوشەنبیری و لاوان
رێڤەبەریا گشتی یا راگەهاندن و چاپ و بەلاڤکرنێ
رێڤەبەریا چاپ و بەلاڤکرنێ - دهۆك
-----------------------------

* ناڤێ پەرتووکێ: دیاریا سەرێ سالێ
* نڤیسەر: Ivan Parvov
* وەرگێران ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
* بابەت:  چیرۆکێن زارۆکان
* تیپچنین: کاژین جەمیل
* دیزاینا ناڤەرۆکێ: بێوار محەمەد
* قەوارە: 26.5 سم × 18.5سم
* ژمارا لاپەران: 25
* تیراژ: 500
*چاپا ئێکێ 2013
* ژمارا سپاردنێ: 2218

وەرزێ زڤستانێ هات و بەفر بلەز د باریت. بەفرێ کراسەکێ سپی یێ کریە بەر دارستانێ و گیانەوەر هەمی ژی یێن چووینە د خانیێن خوّڤە و ل بەر ئاگری د روینشتینە.

لولو گەلەك حەز ژ زڤستانێ ناکەت، چونکی نەشێت بچیتە ژ دەرڤە و یاریان دگەل هەڤالێن خوّ بکەت، لێ ژبەرکو سوباهی جەژنا سەرێ سالێ یە، لەو نوکە ئەو گەلەك یێ کەیفخوّشە و یێ هزرێن خوّ دکەت کا بابا نوێل دێ چ دیاری بوّ وی دگەل خوّ ئینیت.





لولوی گەلەك هزرێن خۆ د دیاریا بابا نوێلی دا دكرن، جار دگۆت دێ تەپەكێ بۆ من ئینیت، جار دگۆت دێ پایسكلەكێ بۆ من ئینیت، هەتا درەنگی شەڤ ئەو ما د ڤان هزران دا و خەوا وی نەهات. ژ نیشكەكێڤە وی د خۆدیكێ ڕا دیت، كو تشتەك ژ ئەسمانی هاتە خوار و كەفتە ناڤ دارستانێ.



لولو ب لەز ژ ناڤ جهێن خۆ دەرکەفت و ملپێچا خۆ کرە ستویێ خۆ، داکو بچیتە ژ دەرڤە و بەرێ خۆ بدەتێ کا ئەو چ تشت بوو ژ ئەسمانی کەفتیە ناڤ دارستانێ. دەستپێکێ لولو ترسیا و هزرکر ئەو ستێرەکە، یان دەهبەیەکە هاتییە ناڤ دارستانێ و دێ نەخۆشیێ گەهینتە گیانەوەران.



لولو دەرکەفتە ژ دەرڤە، لێ دونیا گەلەك یا ساربوو و بەفرێ هەمی تشت نخافتبوون، هەرچەندە لولوی و بابێ خۆ ب رۆژێ ئەو بەفرا دۆرماندۆری مالا خۆ هەمی راکربوو، لێ دارستان یا پربوو ژ بەفرێ و هەوایەکێ ب هێز ژێ دهات.


دوماهیێ لولو گەهشتە نیڤەکا دارستانێ، دارستان ل وی دەمی گەلەك یا سارٚ و تارێ بوو،
لولوی تەماشەی دەوروبەرێن خۆ کر، لێ چ تشت نەدیتن، پشتی هینگێ بێهنا تشتەکێ سەیر هاتە دفنا وی.



لولوی گوینیکەکێ مەزن یێ سوٚر د ناڤ دارستانێ دا دیت، لولو مەندەهوٚش ما و د هزرا خوٚ دا گوٚت: ئەرێ ئەڤ گوینیکێ مەزن چەوا ژ ئەسمانی کەفتیە و چ تێدایە؟!



پاشی وی خۆ نێزیکی گوینیکی کر و دەرێ وی ڤەکر، دا بزانیت کا چ تێدایە.


لولوی گۆت: چ پێنەڤێت ئەڤە گوینیکێ دیارییێن بابا نوئێلی یە، دەمێ د سەر دارستانێ را بۆری، یێ ژ
ئەرەبانکا وی کەفتی، دیارە بابا نوئێلی دیاری بۆ هەمی گیانەوەران دگەل خۆ ئینداینە، بۆ کویڤرویشکێ،
بۆ ژویژی، بۆ سڤۆرەی، بۆ هەمیان...



پشتی هینگێ لولوی ئەو دیاری هەمی د گەل خۆ ئینان و بەرەڤ مالێن گیانەوەران چوو، دا دیارییێن بابا نوێلی ب هەلکەفتا جەژنا سەرێ سالێ بگەهینتە وان.



ل دەستپێکێ لولو بەرەڤ مالا ژویژی چوو و د پەنجەرکێ دا سەحکرە دژوور ڤە، دیت مالا وی گەلەك یا خۆشە و ئاگرێ هەلکریە و دارا جەژنێ ژی یا خەملاندییە، لولوی دڤیا بچیتە د ژوورڤە، لێ ژویژی یێ نڤستی بوو لەو دیاریا وێ بۆ دانا بەر دەرگەهی.



پاشی لولو بەرەڤ مالا هەردوو کوێڤرویشکان چوو دا دیارییێن بابا نوێلی بگەهینتە وان ژی. لولوی گوهـ ل دەنگێ کەنیا وان بوو، وی ژی دڤیا بچیتە دەڤ وان و یاریان دگەل وان بکەت، لێ وی بڕیار دا ئەو ئەڤ شەڤە دیارییێن هەمی گیانەوەران بدانتە بەر دەرگەهێن مالێن وان.



پشتی هینگێ لولو گەهشتە دەڤ وێ دارێ، یا مالا سڤۆرەی ل سەر. دونیا گەلەك یا ساربوو و هەوایەکێ تەزی دهات، خەوا لولوی ژی گەلەك دهات، لەو دیاریەك بۆ سڤۆرەی ژی ب وی چەقێ دارێ ڤە کر یا ل بەر دەرگەهێ مالا وی.

لولوی ل وێ شەڤێ دیارییێن هەمی گیانەوەران بۆ گەهاندنە بەر دەرگەهێن مالێن وان، لێ ژبەرکو بەفر گەلەك باریبوو و هەوایەكێ ب هێز ژێ دهات، وی رێكا مال بەرزە كربوو و نەدزانی كا چەوا دێ زڤریتە مال.



بەفر گەلەك باریبوو و لولوی چ تشت نەدیتن، هەر وەسا وی گەلەك هەست ب سەرمایێ دکر، هەر دیسان خەوا وی ژی گەلەك دهات و نەدزانی دێ چ کەت و چ مالێن نێزیك ژی ل وێرێ نەبوون.



**لێ چاڤێ لولوی ب گوینیکێ دیاریان کەفت، لولوی زوی خۆ گەهاندە گوینیکێ دیاریان و چوو تێدا و کوریا خۆ ل دۆر خۆ ئالاند، دا پیچەکێ وی گەرم بیت. پاشی ئێکسەر چوو د خەوەکا گران دا و نڤست.**



بەفر بەردەوام د باری و هەوایەکێ ب هێز ژی دهات، هەر وەسا بەفرێ شوین پێن لولوی ڤەشارتبوون و هێدی هێدی دا وی گوینیکێ چوویە تێدا ژی بەرزەکەت.







ژ نیشکەکێڤە لولوی چاڤێن خۆ ڤەکرن، دیت ئەو یێ ل مال و یێ ل بەر ئاگری، نۆکە گەلەك کەیفا وی هات،
کو جارەکا دی ئەو ڤەگەریایە مال، لێ وی هیشتا باوەر نەدکر و گۆت: چ پێنەڤێت ئەڤە خەونە ئەز تێدا...



دایبابێن لولوی گۆتێ: کورێ من یێ خۆشتڤی، ئەم گەلەك ترسیاین دەما مە دیتی تو د ژوورا خۆڤە نینی، لێ گیانەوەرێن دارستانێ هەمیان دگەل مە، ل تە دگەریان هەتا مە تو دیتی.

لولوی خۆ د دایبابێن خۆ وەرکر، سۆزدایێ کو ئەو ج جارێن دی بێ دەستویرییا وان
ژ مال نەدەرکەڤیت و گوهدارییا وان بکەت.

